(7)

نادر کە گوێی لەم قسانە بو، لە قین دا خرۆشا، دەستی دایە چەک و هەڵی کوتایە سەری. شیری میسری ئاوداری بۆ داوەشان

خان خێرا سپەرەکەی دایەبەری

شیرەکەی لە سپەرەکەی دا پریشکی لێ بەرز کردەوە و دو کەرتی کرد

بەڵام خان خرۆشا بە رق و قینەوە شمشێرێکی لە نادر سرەواند شانی تا دامانی دادڕی

نادر تەکانی دا پێی لە تەناف گیرا و کەوت، خان وەکو شێری خوێنخۆر سواری سنگی بو.

(8)

نادر وتی:

"ئامان!

بەوری بێ سامان!

شێر ئامان لە شێر داوا ئەکا

من خراپەم کرد، تۆ چاکە بکە!

نەزمی نادری بە فیرۆ مەدە

لە جێی بەدکاری با بەدی نەکرێ

لە رێی بەدکاران دا هەر چاکە دێ

نمەکی نادر بێنەرەوە بیر، نمەک حەرامی مەکە

لە خاکی ئیران دا کەسێکی تری وەکو من هەڵ نەکەوتوە، لە دوای من ئیران وێران مەکەن

....

من دەرهەقی ئیران خراپەم نەکردوە

تۆڵەی شێرانی ئیرانم سەندۆتەوە

حەقی سەد ساڵەی دەردی دلێرانم لە ئەفغان و لە توران کردەوە

مەردانم لە چنگاڵی شێر دەرهێنا

تۆڵەی هەموانم وەرگرتەوە و دامەوە بە خاوەنەکانیان

......

......

(9)

محەمەد قولی خان وتی:

هەی نادر!

قەزات لە یەزدانەوە بۆ دابەزیوە

ئەگەر هەوڵ و جەنگ بو ئێمە کردمان

ئەگەر ناوی نادر بو ئێمە هێنامان

تۆ شوانێکی وێڵگەردی دەشتەکان بوی!

ئێمە تۆمان خستە جێگەی جەمشید و دارا، بوی بە سولەیمان، بوی بە سانی سکەندەر، خاقان و قەیسەر بۆ پابۆسی ئەهاتن، بە زەبری شمشێر شێرانی ئێرانمان، بە شەڕ توران، بوی بە خاوەنی چەند موڵکی خانان، یەک یەک هەمویمان هێنایە ژێردەستی تۆ

تۆ هێشتا گاڵۆکی شوانیەکەت ماوە
ئێمە بوین تۆمان لە نەدرەوە کرد بە نادر
کەچی دەنگی دلێرت لە ئێران بڕی، هێشتا تۆ نارازیت
پارەت لە ئێران دا نەهێشت هەمویت برد لە قەڵای کەڵات دا کەڵەکەت کرد
کوێخا و سەرهەنگ و سەردارەکانت سەربڕی منارەت لە کەلەیان دروست کرد، سەروماڵت زەوت کردن، هەندێکیانت بە جەللاد سپارد و چاوی هەندێکیانت دەرهێنا
زیرەی زەلالەت و واوەیلای خەڵکی وڵات، لە دەس زوڵمی تۆ، لە گەردون تێپەڕی
ئافرەتانی نازدار بۆ فرۆشتن دران بە دەڵاڵی شاران
ماڵە ئێرانی دنیای لێ تەنگ بو هەڵاتن بۆ وڵاتی فەرەنگ
دیلەکانی، کە بە زۆر گیراون، رەوانەی ئەفغان کران
ناڵەی ئەسیران، ئاخ و ئۆفی هەناسەساردان، چەمەرەی شیوەن، بە زۆر سەندنی سێ جار باج لە خەڵک و سێ جار سزای ئالیک لە سارەوان، ئێرانی داغان کرد، ئەمجار کوشتنمان ئەسپێری بە ئەفغانی نادر!
مەپارێزرەوە، کاتی کڕوزانەوە نەماوە. ئەتکەین بە پەندی واتەواتی ساڵان
زۆرت زوخاو دەرخوارد داین، ئیتر وەختی مردنتە، ئەمشەو ئێمە و تۆ دیوانمانە، سبەی پێ ناخەیتەوە ناو چادرەکەت!
بێزارین لە زوڵمی تۆ
ئەگەر خوای توانا یاریدەدەر بێ تاوی بەرگەی جەوری تۆمان نەماوە. هەلی لاڵانەوە تێپەڕیوە، فڕوفێڵ مەخەرە کار، کێ مار بە بریندار بە جێ ئەهێڵێ؟
دەرونم لە داخی تۆ پڕە، ئەبێ سەرت بپەڕێنم!

(10)

محەمەد قولی خان لە داخان دا شێوا
بە خەنجەر سەری لە لەشی جیا کردەوە. لاشەی بێ سەر، وەک مەلی سەربڕاو، لە خاک دا کەوتە لنگەفرتێ.
جەمشید، دارا، کەیکاوس، نەوشیروان، رۆستەم، خوسرەو
ئەمیش هۆشی تێدا نەما، گیانی سپارد بە قابیز
ئاگای لەم دنیایەی ئێستا نەما.
گەردون بۆ حاڵی نادر دادی ئەکرد
تەخت، جقەی تاج، خەزێنەی پارە، خواجە، غوڵام، کەنیزەکی حەرەم، سەراپەردەی چەتر، خەیمەی مرواری، قاپ و قاچاخ، فەرش و فروش، چەک و تفاقی شەڕ، تیپی سپا، تۆپ و تۆپخانە، جارچی، چاوەشی هەی ئەتلان... ئەمانە هەمو بێ خاوەن مانەوە.
نادر گیانی بە دەستەوە دا.

(11)

بە مەرگی نادر: بو بە رۆژی قیامەت، دنیا بو بە دەیجور، ئاسمان و زەمین پەردەی تاریکیان پۆشی، ماسی سیاپۆش، ئاسمان خەمبار، رۆژ گیرا، مانگ ستێزا، ئەستێرەکان لە ئاسمان رایان کرد، سوری

ئیسرافیل لێ درا، نادر لە ریشە دەرهێنرا، زنجیرەی داراتی دارا لە گەڵ خاک یەکسان بو، ئەتوت کەس لە دایک نەبوە.

سەرلە ئێوارە سەری نایە سەر تەخت و تاج، نیوەشەو نە سەر ما، نە تەخت و نە تاج

سەرلە ئێوارە بە سەرمەستی نوست، بەیانی بە دەست دوژمنەکانیەوە بو

بە سورێکی زەمان، قەهری قادر، نە نادری هێشت و نە نادریی

کاری چەرخی چەپگەرد وەهایە: بازیچەی بازاڕ

ئاشوبی فەلەکی پڕ مەکر و ئەفسون و سوڕانی گەردون

گا شا، گا گەدا، گا سوڵح و گا جەنگ، گا سەر لە سەر سەنگی گۆڕ

گا بە فەڕ و ناز، گا بە دڵخواز، گا سەر بێ نزیک و ناز

گا بە عەیش و نۆش بادەی گوڵناری، گا لێوی وشک

گا بە جۆشی کینە و هەی هێرشبردن، گا نگونی خاکی خوێناوی لالەرەنگ

گێژی گەردونە، ساڵی سەد جار، دەمێ شادمان، دەمێ دڵئازار

چەرخی دەورانە گەردشی گەردون، گاهێ سەرفراز و گاهێ سەرنگون

سەرەنجام، نادریان سەرنگون کرد

سامانەکەیان تێکەڵاوی خاک و خوێن کرد

خوێنی دوژمنانیان لە خوێناوی خواردەوە

ماڵ و خەزێنەیان بە تاڵان برد.

(12)

کە سپا ئاگاداری کاری نادر بون و، قاو کەوتە ناو لەشکرەوە، خرۆشان، رژانە حەرەمی سەراپەردەی شاوە

لە چوار لاوە پەلاماریان دا، بۆ تاڵانی بە ناو چادرگاکە کەوتن. هێرشیان کردە سەر خێوەتەکەی نادر .....

ناڵەی فەرزەندەکانی ئەهاتە گوێی، بەڵام دلێر لە خەوی خامۆشی دا بو، بە زیرەی زاری بە جۆری نادریان ئەلاوانەوە بەردی رەقیان ئەتوانەوە، ئەیان وت: "کوانی سەرداری ئیران؟ بەوری بێ منەت لە سەرکێشیی شێران؟ تاج و تەختت بە تاڵان برا، هەمو دیلەکانیان بە ئەسیر برد.

مناڵە دڵبەندەکانیان بە تیغی ئەڵماس لە بنجوبێخ دەرهێنا

بانوی بانوانی پەروەردەی پەردە هەمویان بە دیلی بران

قۆشەن کۆنەقینیان بیر هاتەوە تەختی بەختی ئیرانیان بە بادا

چەتروچاتریان تێکوپێک دا، فەرش و فروشیان تاڵان کرد

قاپ و قاچاخ و کەلوپەلی چادر، خەزێنەی خەرگای نادرەی نادر، تەختی تاوسیان برد. خەیمەی مرواریيان پارچەپارچە کرد!

گەنج و خەزێنەیان بە تاڵان برد، کردیان بە پەندی واتەی ساڵان

بانوانی فەیرۆزە خاڵانی شا، کەنیزەکە نازک نیهاڵەکان

بە یەک "کن فیکن" زنجیرەی نادر فەوتا، نە نادر ما و نە چەتری چادر(265)

................

## گێڕانەوەی چیرۆکی کوشتنی نادر(247)

دانەر لەم بەشەی داستانەکەی دا چیرۆکی کوشتنی نادرشای گێڕاوەتەوە. خەیاڵ و واقیعی تێکەڵاو کردوە. چەند دیمەنێکی بە شیعر هۆنیوەتەوە. ئەگەرچی شیعرەکان لاوازن، وشەی دوبارە و، قافیەی دوبارە و، ڕستەی دوبارەی زۆر تێدایە. بەڵام هەندێ لە دیمەنەکانی ڕوداوەکەی بە سەرکەوتویی بەرجەستە کردوە:

### دیمەنی 1: پیلانی کوشتنی نادر

نادر هێزێکی زۆری ساز داوە بچێ بۆ سەرکوتکردنی یاخیبونی کوردەکانی قوچان. لە کامپێکی جەنگی دا کۆی کردونەتەوە. پێشتر چەند جارێ هەوڵی کوشتنی دراوە، بەڵام هەوڵەکان ناکام بون. لە ئەنجامی ئەوانەدا نادر توشی "پارانۆی" بوە. هەمو جار زۆر بە توندی سزای ئەوانەی داوە گومانی لێ کردون. گومانەکەی ئەگەر ڕاست بوبێ یان وەهم. ئەمجارە گومانی لە پاسەوانە ئێرانیەکانی کردوە، ترساوە بیکوژن. لەشکرەکەی تێکەڵاو بوە لە نەتەوە و تیرە و تایەفەی جیاواز. یەکێ لەو هێزانەی لەگەڵی بون ئەفغانی بون. لەگەڵ ئەفغانیەکان پیلانی داناوە بۆ کوشتنی سەردارە ئێرانیەکانی ناو هێزە تایبەتیەکەی خۆی، ئەفغانیەکانی ڕاسپاردوە پیلانەکەی جێبەجێ بکەن، هەمویان بکوژن. کەسێ هەواڵەکەی بە سەرداری ئێرانی گەیاندوە. سەرداری ئێرانی، ویستویەتی دەسپێشکەری بکا، لە ترسی ئەوەی بەیانی بیکوژن ئەو کەوتۆتە دارشتنی پیلانی کوشتنی نادر.
"قۆبیای کوژران" لە دەرونی هەردوکیان دا، هەم نادرشا و هەم محەمەد قولی خان، پاڵپێوەنەری سەرەکی بوە بۆ دارشتنی پیلانی کوشتن لە دژی یەکتری، پیلان و پیلانی بەرامبەر. دانەر وەسفێکی وردی باری سایکۆلۆجی سەرداری ئێرانی و هاورێکانی بە وتارەکەی قولی خان و کاردانەوەی هاورێکانی دەربریوە. سپڵەیی نادر بەرامبەر سەردارەکانی، خۆبەزلزانینی ئێرانی لە بەرامبەر نائێرانیەکان دا، ترسان لە کوژرانی نارەوا، ئەمانە بیانوەکانی خان بون بۆ رەواییدان بە کوشتنی نادر.

### دیمەنی 2: دادگایی پێش کوشتن

روبەڕوبونەوەی نادر و بکوژەکانی ماوەیەکی کورتی خایاندوە، گەلێ سەرچاوەی مێژویی، کە هەندێکیان نزیکی بون، گێڕاویانەتەوە، بەڵام ئەمەی ئەڵماس خان ئەگەرچی بایەخی بە دارشتنی پلان و ئامادەکاری تیمی جێبەجێکردن و جۆری کوشتنەکەی داوە، بەڵام گفتوگۆی نادر و بکوژەکەی بە جۆرێ دارشتوە زۆرتر لە دادگا و دادگایی ئەچێ نەک لە شەڕەشیرێکی کورتخایەن. دانەر، هونەرێکی جوانی نواندوە لە دەرخستنی ناخی دەرون و لایەنی سایکۆلۆجی بکوژ و کوژراودا لە ساتی ڕوداوەکەدا.
بواری بە نادر داوە داکۆکی لە خۆی بکات، چاکەی خۆی بە سەر خەڵکی ئێرانەوە باس بکات، سەروەریەکانی خۆی بە شانازیەوە بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی هەستی ئێرانێتی لە دەورنی بکوژەکەی دا ببزوێنێ و، هەتا بکوژ لە بڕیارەکەی پەشیمان بکاتەوە جارێ هەڕەشە و ترس و جارێ پاڕانەوە و بەزەیی پیشان ئەدا.
لە هەمان کات دا، بواری بە بکوژ داوە کە تاوانەکانی نادر ڕون بکاتەوە و بیانوەکانی خۆی بۆ کوشتنی ئەو بسەلمێنێ.

### دیمەنی 3: دانیشتوانی حەریم

دانەر، بە درێژایی داستانەکەی توخنی ژیانی تایبەتی نادر نەکەوتوە، بەڵام کە باسی گێڕانەوەی تاڵانکردنی سەراپەردەی ناو خێوەتگای شاهانەی نادر ئەکا، ئینجا هەندێ لایەنی ژیانی تایبەتی ئەبینرێ، کە لەم

سەراپەردەیەدا، کە لە خێوەتی شا و چەند خێوەتێکی تر پێکهاتوە و، لە ناو کامپێکی جەنگی دا بوە، چ جەنجاڵیەکی مرۆڤیی لە ژن و کەنیزەک و خواجە و غولامی تێدا بوە:

ژن و دۆستە تایبەتیەکانی:

بانوی بانوانی زەربافتی زەرپۆش، بانوی بانوانی پەردەپەروەردە، بانوانی شا فیرۆزە خاڵان، نازکانی سەهەندپەروەر، نازدارانی شای نازپەروەردە، مەحبوبانی حامیلە، مەحبوبانی تاج تەلا، خاسەکی مورەسەع کەمەر، زەریفانی زێڕ لە گوێ...

کەنیزەکەکانی:

کەنیزانی تەلاتاقی، کەنیزانی زوڵف تا دامان، خاسە کەنیزان، نازک نیهاڵان.

لە رەگەزی نێرینەش:

میرزای میرزایانی نوتفەی نادر، میرانی تاج و کەمەرزێڕ.

بۆ خزمەتی ناوماڵ و کۆڕی مەینۆشی:

غولامانی سادە، ساقی، خواجە..

"خۆش رابواردن" کە نیشانەیەک بوە لە "دەبدەبەی شاهێتی" بەشێ بوە لە ژیانی رۆژانەی شاکانی ئێران، لە مەش دا نادر چاوی لەوانەی پێش خۆی کردوە.

**دیمەنی 4: تالانی سەر و ماڵ**

دانەر لە چەند بۆنەیەک دا باسی تالانی گێڕاوەتەوە، بە تایبەتی دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکان. رەنگە یەکێ لە گەورەترینی هەمو تالانیەکانی کە نادر لە شەڕەکانی دا کردویەتی، تالانکردنی هندستان بێ.

دانەر، لەم بەشەی داستانەکەی دا، باس ئەکا کە هەواڵی کوشتنی نادر گەیشتۆتە ناو لەشکرەکەی، پشێوی کەوتۆتە ناو سپاکەیەوە، لە هەمو لایەکەوە بە نارێکوپێکی رژاونەتە ناو خێوەتگاکەی و، لە کەلوپەل و گیاندار هەرچییان بەر دەس کەوتبێ تالانیان کردوە.

سەری مناڵ و نەوەکانی نادریان بڕیوە.

ساقی و خواجە و غولامەکانیان کوشتوە.

ورگی ژنە ئاوسەکانیان دڕیوە.

ژنە جوان و نازدارەکان و کەنیزەکەکانیان بە ئەسیر بردوە.

تەختی تاوس، تەختی نوستن، تەختی شایەتی، خەیمەی مرواری، تاجی شایەتی، گەنجی خەزێنە، خەزێنەی خەرگای نادرە، چەتری چادر، ئەسبابی چادر، فەرش و فروش، قاپ و قاچاخ، ئەسپ و زین، چەک و تفاقی شەڕ... هەر کەس و تاقمێ شتێ لەمانەی بەر دەس کەوتبێ تالانی کردوە.

ئەمە شێوەیەکی ئاسایی تالانی سەروماڵی کەسایەتی و هێزی شکاوی ئەو سەردەمە بوە.

ئەڵماس خان، لە هۆنینەوەی هەمو ئەو دیمەنە جۆراوجۆرانە، ویستویەتی مەبەستە سەرەکیەکەی خۆی بسەلمێنێ، کە ئەویش "پوچی ژیان" بوە.

# هۆنراوەی فێرکاری: گەشتێ لەگەڵ رواری

هۆنراوەی فێرکاری: (رواری وەک نمونە)
گوڵچنینێ لە بەرهەمەکانی

## هۆنراوەی فێرکاری: (رواری وەک نمونە)

شیعری خۆیی ئەو هەڵبەستەیە کە لە ناخی دەرونی شاعیرەوە دەرئەچێ و، هەست و سۆزی تایبەتی خۆی بەرامبەر بە شتێ دەرئەبڕی کە بزواندویەتی. بەڵام شیعری بابەتی بریتیە لەو شیعرەی کە شاعیر شتێ ئەڵێ لە دەرەوەی هەست و سۆزی خۆیەوە. ئەگەرچی هەردو جۆرەکە لەوەدا هاوبەشن کە هەردوکیان کێش و قافیەیان هەیە و هەردوکیان ئاهەنگی مۆسیقا لە وشە و رستەکانیان دا هەیە، بەڵام بەویان ئەڵێن شیعر و بەمیان ئەڵێن هۆنراوە (نظم).

هۆنراوەش چەند چەشنی هەیە، چەشنێکیان هۆنراوەی فێرکاریە.
هۆنراوەی فێرکاری بابەتێکی تازە داهێنراو نیە. یۆنانیەکان، رۆمانیەکان، هیندیەکان، فارسەکان، عەرەبەکان، لە کۆنەوە دایان هێناوە. سەردەمێ کە خوێندەواری کەم بوە و نوسین و خوێندنەوە دژوار بوە، لە بەرکردنی پەخشان ستەم و لە بەرکردنی هۆنراوە ئاسانتر بوە. بە تایبەتی بۆ فێرکردنی بابەتێکی دیاری کراو.
هۆنراوەی فێرکاری راستەوخۆ رو لە وەرگر ئەکا، هەوڵ ئەدا وەرگر مەبەستەکەی وەکو راستیەکی بێگومان بسەلمێنێ و، بابەتەکەی لەبەر بکا و لە بیری بمێنێ. بابەتەکانی هۆنراوەی فێرکاری لە ئەدەبی گەلان دا، بە تایبەتی هی عەرەبی چەند جۆرێ بون:

جۆرێکی، ئامۆژگاری و رێنماییە بۆ خواپەرستی، باوەڕی دینی، رەوشت و خوی باش، جیاکردنەوەی خێر و شەڕ و چاکە و خراپە، مرۆڤ ئەبێ چی بکا و خۆی لە چی لابدا. بۆ ئەوەش بابەتەکەی ئاخنیوە بە گەفی سزای دۆزەخ بۆ ترساندن و بە گفتی پاداشی بەهەشتی بۆ هاندان.
جۆریکی تری، هۆنینەوەی درەختی بنەماڵە و، ژیاننامەی گەورەپیاوان و کارە ئەفسانەییەکانیان بوە.
جۆرێکی تری، فێرکردن و تێگەیاندن و راهێنانی پیشە و هونەر و زانست بوە. نمونەی ئەمە لای یۆنانیەکان ئەگەڕێتەوە بۆ 8 سەدە پێش زاین، "هزیود" لە پاڵ مێژوی خواکان دا، هۆنراوەیەکی داناوە، بۆ باسی جۆرەکانی کشتوکاڵ. رێنمایی جوتیارانی کردوە دەربارەی وەرزەکانی ساڵ و لە هەر وەرزێک دا چی ئەچێنرێ و چی کەرەستە و تفاقێکیان پێویستە بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان.
عەرەب، بە هۆنراوەی فێرکاریyیان وتوە ئورجوزە "ارجوزە" چونکە بە زۆری لە سەر بەحری "رەجەز" ی عروز دانراوە. ئەلفیەی ئیبن مالیک "الفیە ابن مالک" کە هەزار بەیتە بۆ فێرکردنی رێزمانی عەرەبی یەکێکە لە بڵاوترین ئورجوزەکانی زمانی عەرەبی، تەنانەت لە ناو مەلا و فەقێکانی کوردیش دا ناسراو بوە.

ئەم شێوە هۆنراوەیە، هۆنراوەی فێرکاری، لە هەر 3 مەدرەسەی ئەدەبیی کوردی دا هەبوە. بۆ نمونە:
بە کرمانجی سەرو، ساڵی 1094 ک ئەحمەدی خانی (1061 – 1119 ک) "نۆباری پچوکان" ی داناوە.
بە کرمانجی خوارو، ساڵی 1210 ک شێخ مارفی نۆدێ (1157 – 1254 ک) "ئەحمەدی" ی داناوە.
بە گۆرانی، شێخ محەمەد وەسیمی تەختەیی (1118 – 1171 ک) و مەلا خضری رواری (؟ - ) چەندین بابەتیان هۆنیوەتەوە.

مەلا خضری رواری لە "رۆڵە بزانی" دا بە رێزێکی زۆرەوە ئاماژە بۆ کەسێکی تر ئەکا کە پێش ئەو بابەتی دینیی ئیسلامی بۆ مەبەستی فێرکاری بە هەمان زمان هۆنیوەتەوە، ئەڵێ:
کەرێێنیش بە نەزم، یاگێو گرد کەسیم
ئوستادی، شێخی، محەمەد وەسیم(8)
لە "دەوڵەتنامە" ش دا دیسان باسی هەمان مامۆستا ئەکا:
تەعریف و سەوتی شێخی: شێخ وەسیم
پێ دوە شیعرە کەردەنش تەعلیم(38)
مەبەستی ئەویش شێخ محەمەد وەسیمی تەختەیی بوە کە چەند کتێبی بە هۆنراوەی گۆرانی لە بواری جیاوازدا داناوە. ئەگەر رواری ساڵانی 1170 - 1171 ک وەکو خۆی لە کۆتایی کتێبەکان دا نوسیوێتی، لە قەڵاچوالان خەریکی نوسینەوەی "تحفە المحتاج" بوبێ و بە شێخ وەسیم بڵێ "مامۆستام و شێخم و لە جێگەی گشت کەسم" ئەبێ هەردوکیان لەو ساڵەدا لەوێ بوبن و، ئەم هونەرەی لە ئوستاد و شێخەکەیەوە بۆ بە جێ مابێ.

بنەماڵەی شێخانی مەردۆخەیی سنە چەندین زانایان تێدا هەڵکەوتوە، کە هەندێکیان جگە لەوەی مەلای باش و مامۆستای شارەزای زانستە دینییەکان بون، دانەری کتێب و شیعر و هۆنراوە بون. یەکێ لەوانە شێخ محەمەد وەسیمی تەختەییە (1118 – 1171 ک).

شێخ وەسیم ساڵی 1163 ک لە شاری سنە بوە.
لەو سەردەمەدا حەسەنعەلی خان والی ئەردەڵان بوە. ململانێی دەسەڵات لە ئێران لە نێوان کەریم خانی زەند و ئەلاقولی خانی زەنگەنە و ئازاد خانی ئەفغان و ئاغا محەمەد خانی قاجاردا لەوپەڕی توندوتیژی دا بوە. لە هەمان زەمان دا ناکۆکی نێوان سەلیم پاشا و سلێمان پاشای بابان تەقیوەتەوە. حەسەنعەلی خان بۆتە بەشێ لەو ململانێ و ناکۆکییانە. بەو هۆیەوە هەلومەرجی سەرانسەری ناوچەی ئەردەڵان بە خراپی تێک چوە و بۆتە مەیدانی شەڕوشۆڕ. شاری سنە چەند جارێ داگیر کراوە و وێران بوە و، زۆری دانیشتوانی چۆڵیان کردوە.
شێخ وەسیم کە لەو سەردەمەدا، قاضی محمد شریف، نوسەری "زبده التواریخ" ی مێژوی ئەردەڵان، بە "قطب العارفین" ناوی بردوە لە ئەنجامی ئەو نائارامیەدا سنەی بە جێهێشتوە روی کردۆتە هەورامان. پێ ئەچێ هەر لەو ساڵانەدا بە یەکجاری چوبێتە قەڵاچوالان.
شێخ وەسیم ساڵی 1171 ک لە قەڵاچوالان مامۆستا بوە، بە پەتای تاعون (چاوەقوڵە) کە لەو ساڵەدا بڵاوبۆتەوە، مردوە. شێخ وەسیم، وەکو دانەری "مشاهیر کرد" (روحانی: 238/1) ئەڵێ چەندین کتێبی فێرکاری لە بواری جیا جیادا، هەر لە باوەڕی دینیەوە تا سەر ئوستەرلاب و باسی ساڵی کەبیسە، بە زمانەکانی کوردی - گۆرانی، فارسی، عەرەبی داناوە.

دانراوە هۆنراوەییەکانی شێخ وەسیم، هێشتا بڵاونەکراونەتەوە. ئەوەی بە لەهجەی گۆران بڵاوکرابێتەوە، چەند پارچەیەکە دانەری "بوژاندنەوەی زانایانی کورد" (قەرەداخی: 168/2 و 353/6) لە کتێبێ بە ناوی "ئەخلاق" ەوە بڵاوی کردۆتەوە. ئەویش لە دەسنوسێکی سالی 1184 ک گواستویەتیەوە. لە سەرەتاکەی دا ئەڵێ:
حیکمەت و عیفەت، شەجاعەت و عەدل
- اصل الاخلاق - مِن یەک تا چەهارەم
فەرعیشان هەنی فرە بشنەوە
لە یەک تاکو چل - والله یعلم -
ئەوەل عیبادەت، ئیخلاسەن دوەم
سێیەمین دوعا، شوکرەن چەهارەم
ئینجا یەکە یەکە ئەم چوار ئەخلاقە ورد ئەکاتەوە بەڵام ناوە عەرەبیەکانی وەکو خۆی بەکارئەهێنێ بێ ئەوەی هیچ وشەیەکی کوردی‌یان لە جێگە دابنێ. (362/6)
دانراوەکانی شێخ وەسیم ئەگەر بە شێوەیەکی زانستی لێکۆڵینەوەیان لێ بکرێ، نرخێکی مێژویی گرنگیان ئەبێ بۆ ئەدەب و فەرهەنگ و زمان و بیری کوردی.

وەکو رواری خۆی نوسیوێتی ناوی (خدر) خضری کوڕی مەولانا ئەحمەد بوە، واتە باوکیشی زانای ئاینی بوە، لە گوندی روار (رودبار) ی ناوچەی هەورامانی سەر بە ولایەتی ئەردەڵان لە دایک بوە، روار کەوتۆتە خوارووی رۆژهەڵاتی رێژاو لە نزیک روباری سیروان. ناوچەیەکی شاخاویە. زمانی خەڵکەکەی هەورامیە.
بۆ زانینی ساڵەکانی ژیانی هەندێ نیشانەی دیار لە بەرچاون.
ساڵی 1170 ک لە قەڵاچوالان بوە. ئەو سەردەمە قەڵاچوالان پایتەختی میرایەتی بابان بوە. لەو سەردەمەدا ناوەندێکی فەرهەنگی گرنگ بوە. چەند مەدرەسە و مزگەوت و چەندین مەلای زانای لێ کۆبۆتەوە. لە قەڵاچوالان سەدان مەلای باش خوێندنیان تەواو کردوە و، سەدان کتێبی باشی لێ بوە و، سەدان کتێبی باشی تێدا نوسراوەتەوە و تێدا دانراوە.

لەو ساڵەدا سلێمان پاشای خالید پاشا میری بابان بوە. قەڵاچوالان شارۆچکەیەکی بچوکی نائارام بوە. میرەکانی بابان لە ناوخۆیان دا ناکۆک بون و، پیلانیان لە یەکتری گێراوە. دەسەڵاتی رۆم لە بەغدادەوە و دەسەڵاتی عەجەم لە کرماشانەوە بەردەوام دەستیان تێ وەرداوە و چاویان لە سەری بوە بیخەنە ژێر حوکمی خۆیانەوە.

رواری روبعی یەکەمی کتێبی "تحفه المحتاج" ی ناندراوی "ابن حجر" ی بە خەتی خۆی لە قەڵاچوالان نوسیوەتەوە. هەر لەو دەوروبەرەدا "روبعی دوەم" یشی هەر لەوێ نوسیوەتەوە.

لە کۆتایی روبعی یەکەمی دا نوسیوێتی: "بید الحقير ابن ملا احمد خضر الرودباري الاوراماني معتكفا في الجامع السليمانية ببلدة قلعة جوالان يوم الثلاثاء 1170."

لە کۆتایی روبعی دوەمی دا نوسیوێتی: "الحمد لله على اتمام الربع الثاني بتوفيق هداية الرباني، من الشرح المسمى بتحفة المحتاج في شرح المنهاج للعالم الفاضل الكامل المشتهر بابن حجر بن محمد الهيثمي الانصاري المتبحر المعتبر. بيد الفقير الى رحمة الباري، خضر بن مولانا احمد الرودباري سنة 1170 مع عدم السكون فى الاربعين، جزء في الخلوات، وجزء في الملوات، صفحة في الفلاة، وصفحة في الغرفات، اوراق بالليل واوراق بالنهار، شطر في الحجرة، وشطر في الدار، راقما للكتاب و متكلما مع الاحباب، خاطبا لخطاب المخاطبين، وكاتبا كتاب المكاتبين، يوما بالحزن ويوما بالسرور، مع تكرار الايام والاسبوع والشهور، رحم الله امرءآ ينظر الى مقالتي و يتدبر في حالتي ولا يجعلني هدفا للطعن والملام، في زلة الاقدام وانا راجي منه ذكر الخير والسلام."(350/7)

ساڵی 1197 ک کتێبی "دەوڵەتنامە" ی داناوە.

ساڵی 1202 ک دەستی کردوە بە نوسینەوەی "قاموس المحيط" ی فەیروزئابادی. ماوەی ساڵێ خەریکی "كتابة و مقابلة" ی بوە. بەڵام لەگەڵ خەڵکی روار کێشەی هەبوە، بە "زاڵم" ناویان ئەبا. لە بەر ئەوە رواری بە جێهێشتوە. ماوەی چوار مانگ لە هاتوچۆدا بوە تا سەرەنجام لە گوندی "ئارمان" گیرساوەتەوە.

ساڵی 1203 ک لە گوندی ئارمانی سەر بە ولایەتی ئەردەڵان بوە. لەم بارەیەوە لە کۆتایی نوسینەوەکەی دا ئەڵێ:

"احمد الله الذي اعدنا لاستكتاب مفاتيح كلامه بتحرير القاموس وامدنا لاكتساب تصحيح تمامه بتاييد الناموس. وشكرا له في مقابلة تجديد نعمه تصحيحا، وحمدا له على مناولة كلامه ترقيما وترجيحا، وصلى الله على من سبح في كفه الحصاة بدل الخط تسبيحا، وعلى آله واصحابه الذين حاولوا للدين تنقيحا.

فيقول الفقير المرتجى الى رحمة الباري، ابن ملا احمد، خضر الرودباري، من ناحية ارمان من توابع اردلان: فرغت من كتابة هذه النسخة الشريفة ثانيا من النسخة الاولى بخطي –ايضا- التي قابلتها بنسختين صحيحتين احداهما قوبلت بنسخة المصنف بلا واسطة، وهذه بواسطتين ظهر يوم الجمعة لثمانية عشر من شهر صفر المبارك بتوفيق الله تعالى وتبارك 1203 متحريا لمسطره على الوضوء تماما، ولكتابته ايضا غالبا، اكراما لما فيه من لغة الله القديم السرمدي، ولسان الرسول المكي العربي، مكتسبا لنيل (ال)ثواب السنة النبوية، وتيمنا لدوام دولة من بيمن همته عمر ولاية الاردلان بعدما دارت خواء هاوية، ونضر ايالة الكردستان بعدما صارت هواء خاوية، وقد اصبح قبل سماءها ارضا وطولها عرضا، لان في ايامه ارخى عذبة الدعة والسعة اهل العمامة، ونال الانام فى المنام بالامن والسلامة، الذي شوكته اخذ بالاقدام والنواصي، وحملته شبكة النوافر والقواصي، المقدم بالحسب على الاكفاء والاقران، والمتقدم بالنسب والاجداد الفخام العظام في (ال)ايران، الخان بن الخان، العالي الوالي خسرو خان، بن الخان احمد خان، لازال موفقا بعناية المعز المنان، وانيقا حظه وجده ببهجته وبسطته كالجنان، وكل ذلك بحمد الله فقد لا اقول ذلك سمعة ومداهنة، لان الخبر ليس كالمعاينة، بل شكرا لانعامه، وذكرا

لاكرامه، فمن لم يشكر الناس لم يشكر الله، بلغه الله الى اقصى مناه، ورزقنا الخاتمة الحسنى واياه، يا الله يا الله يا رباه، وعلى محمد النبي صلعم وعلى آله واصحابه الذين اهتدوا بهداه.
آمين يا اكرم الاكرمين ويا غياث المستغيثين. واحمد لله رب العالمين. تم الختام والسلام." (قەرەداخی: 346/7)

لە بەشێکی تری دا نوسیوێتی:
"....
"وقد حصلت فترة اربعة اشهر بالاسفار العائقة، ختم الله لنا بالافعال الفائقة، وهدانا الى الاعمال اللائقة، وابدلنا من هذه القرية الظالم اهلها، ببقعة يذهب الحزن سهلها، وبدلنا بجوار الاشرار برودبار، بجوار الاخيار، بحق السيد المختار، واله الابرار، ياكريم، يا غفار، آمين، آمين، آمين، آمين، يا رب العالمين، بادئا به منتصف جمادي الاخر يوم الاربعاء 1202." (قەرەداخی: 346/7)
لەوێ لە نوسینەوەی "قاموس المحیط" ی فەیروزئابادی بۆتەوە، کە یەکێ بوە لە فەرهەنگە گرنگ و درێژەکانی زمانی عەرەبی. لە چەند دێڕیک دا کە بە عەرەبی بە بۆنەی تەواوکردنی نوسینەوەی قاموسەکەوە نوسیوێتی ئەشێ چەند زانیاریەکی لێ دەربهێنرێ:
یەکەم، ئەمەیان دوەمین نوسخەی قاموسی "المحیط" ە کە نوسیوێتیەوە و، بە هاوکاری مستەفای، کوڕی چوارەمی، لە گەڵ نوسخەی یەکەمی دا بەراوردی کردوە. واتە هەم خۆی هێشتا لە تەمەنێک دا بوە توانایەکی باشی کاری سەخت و بەرهەمداری لەو بابەتەی هەبوە، هەم لە تەمەنێک دا بوە کە کوڕی گەورەی زانا و پێگەیشتوی هەبوە.
دوەم، لە هاوگوندیەکانی خۆی ناڕازی بوە لە بەر ئەوە لەوێ گوێزاوێتیەوە بۆ جێگایەکی تر.
سێیەم، بە بۆنەی تەواوبونی نوسینەوەی قاموسەکەوە ستایشی خوسرەو خانی کوڕی خان ئەحمەد خان ئەکا، لە لایەکەوە لەبەر ئەوەی لەوەتی ئەو حوکمی ولایەتی گرتۆتە دەست ئەردەڵانی لە وێرانەوە کردۆتەوە ئاوەدانی و، لە لایەکی ترەوە لە بەر ئەوەی بایەخی بە زانایان داوە و ژیانی بۆ دابین کردون. (قەرەداخی: 346/7)

## حاجی قادر و رواری

ناوبانگی رواری و بەرهەمەکانی لە ناو فەقێ مەلای مزگەوتەکانی کوردستان بڵاوبۆتەوە. ئەوسا چاپ دەگمەن بوە، لە بەر ئەوە ئەم بە دەس نوسراوەتەوە و بڵاوبۆتەوە. هەندێکیان لە بەریان کردوە. دیارە هەواڵی دانراوەکانی رواری گەیشتۆتە ئەستەموڵ. حاجی قادری کۆیی (1816 - 1897 ز) لەو شیعرەدا کە بۆ شاعیرانی کوردستانی تەرخان کردوە، ئەڵێ:
وەک مەلا خدری رودباری نیە
شیعری ئاوی حەیاتە تاری (تاڵی) نیە

مەلا خدری رواری مەلا بوە، جگە لەوەی لە مزگەوت دا فەرزەکانی دین و فرمانەکانی مەلایەتی ئەنجام داوە، دیارە مامۆستاش بوە دەرسی وتۆتەوە، هەندێ لە بابەتەکانی دەرسەکانی بۆ ئاسانکردنی فێربون و بۆ لەبەرکردن بە شیعر هۆنیوەتەوە. رواری بۆ ئەو مەبەستە چەند کتێبی داناوە، ئەوەی تا ئێستا بڵاوکراوەتەوە بریتیە لە:

ڕۆڵە بزانی، دەوڵەتنامە، زەمانەی ئەندەن، عەقیدەی کوردی: چوار دانراوی هۆنراوەیین، هۆنراوەی فێرکارین، جەمیل فاروقی ساغی کردونەتەوە. ساڵی 2007 هەر چواری، بە زنجیرە لە 1 تا 4 لە تاران چاپ کراون.

## قاڵبە شیعریەکانی

رواری لە هۆنینەوەی نامەکانی دا پێڕەوی هەمان قاڵبە شیعریەکانی مەدرەسەی ئەدەبیی گۆرانی کردوە:
سەرەتاکەی بە دو بەیتی هاو قافیە دەس پێ کردوە، وتویەتی:

ڕۆڵە بزانی
فەرزەن وەر جە گشت، مەبۆ بزانی

| | |
|---|---|
| ئەسڵ و فەرعی دین، چەنی ئەرکانی | چەنی ئەحکامان، پەی موسڵمانی |
| مەبۆ بزانی: هەریۆ پەنجەنێ | ئەرچی پەنجەنێ، ئەمما گەنجەنێ |
| ئەسڵ و دینیمان: "زاتەن" و "سیفات" | "مەبدەئو" و "مەعاد"، پەنجەم "نوبووات"(8/1) |

هۆنراوەکان مەسنەوی جوت قافیەن و، کێشی سەدر و عەجزی هەمو بەیتەکانی دە بڕگەیین.
لە نامەیەکی تری دا کە ناوی "زەمانەی ئەندەن" ی لێ نراوە پێڕەوی هەمان شێوازی کردوە، لە سەرەتاکەی دا وتویەتی:
زەمانەی ئەندەن
ئەی موسڵمانان یە دەورەی ئەندەن
قاپی شەڕ گوشاد، دەری خەیر بەندەن
عامیان فەتتان، کارشان فەندەن(13/3)

## بەرهەمەکانی رواری

### 1. ڕۆڵە بزانی

"ڕۆڵە بزانی" زیاتر لە 140 بەیتە.
لە نامەی "ڕۆڵە بزانی" دا، رواری ئامۆژگاری وەرگر ئەکا: زانین و کردەوە، زانست و کار، پێکەوە گرێ بدرێ و، کەڵک لە تەمەن وەربگیرێ بۆ بەدەسهێنانی زانست و، بەدەستهێنانی زانستیش بۆ ئەوە بێ لە بوارەکانی ژیان دا جێبەجێ بکرێ. زانای بێ کردەوە وەکو داری بێ بەرە:

| | |
|---|---|
| هەر چیوێت وانا چیوتەر بوانە | بابێوەت زانا یۆتەر بزانە |
| وانات و زانات، وەرش بکەرە | زانات وەرت کەرد، عەمەل باوەرە |
| عیلمەن چون درەخت، عەمەل سەمەرەن | عیلمی بێ عەمەل، باخی بێ بەرەن |
| هەرچی زایع بۆ، پەرێش هەن بەدەل | ئیلا بێ بەدەل عومرەن و عەمەل |
| حەیفەن عومری وێت بدەی بە زایە | جەی دونیا بەرشی بێ وایە و مایە |
| عیلم و عەمەل و عومرت بۆ زیاد | عیلمی بێ عەمەل، مەدەرە وە باد(12/1) |

له بەشێکی "رۆڵه بزانی" دا باسی "ئەسڵ و فەرع" ی دینی ئیسلام و ئەرکان و ئەحکامەکانی ئەکا و، له بەشێکی تری دا باسی محەمەد و باوک و باپیری و دایکی و پێغەمبەرێتی و سفەتەکانی و تەمەنی ئەکا و له بەشێکی تری دا باسی ئەرکانی نوێژ ئەکا.

لەو بەشەدا کە بۆ باسی سیفاتی پێغەممەری تەرخان کردوە وتویەتی:

نیمێ سیفەتێش مەبۆ بزانی
نەک کافر بینە، ئەگەر نەزانی
حەزرەت عەرەبەن، مەکی، قورەیشی
رەسولی ئوممی، جای شادی وەشی
تا ئەڵێ:
پوز و ساق باریک چون بلوری ساف
قوڵکە و پایش نەبێ راست بێ و شەفاف
سایە، یانێ سەی، نەبێش چون مەلەک
جیسمی شەریفش جە نور بی، بێ شەک
خولاسەی کەلام نور سروشتە بێ
جە سەر تا وە پاش چون فریشتە بێ(18/1)

له باسی ئەرکانی نوێژدا وتویەتی:

ئەرکانو نمای مەبۆ بزانی
نەک بە جەهالەت، چەنەش بمانی
ئەوەل: باوەرە نیەت بە تاقی
دوەم: تەکبیرەن، نامی حەق باقی
سێهەم: قیامەن، جە قیبلەی یەقین
چوار: الحمد لله رب العالمین
پەنجەم: رکوعەن، بە بێ ریا بۆ
شەشەم: ئیعتیدال، رو نە دەرگا بۆ
حەوتەم: سوجودەن، سوجدەی روی زەمین
هەشتەم: جلوسەن، پەی دروسی دین
نۆهەم: قوعودەن، قەرارگای تاعەت
دەهەم: تەحیاتەن، کەلیمەی شادەت
یانزەهەم: سەڵوات بە روی رەسول بۆ
دوانزەهەم: سەلام یا خوا قەبول بۆ
سیانزەهەم: تەرتیب، وەر نەدەی جە دەس
تا جە رۆی مەحشەر نەبی زوان بەس
مەزهەب شافیعی، ئیمام مەشهورەن
دینمان سەحیح، هەم بێ قسورەن(22/1)

**2. دەوڵەتنامە**

دەوڵەتنامە یەکێکی ترە لە دانراوە فێرکاریەکانی رواری. رواری خۆی مێژوی دانانی دیاری کردوە:

تاریخی نەزمش مەبۆ شنەفتەن

هەزار و یەکسەد نەوەد و هەفتەن (1197)

هۆی دانانی کتێبەکەی بە شێوەی گۆران و بۆ خەڵکی کوردستان لە بەشی "سبب نظم کتاب" دا رون کردۆتەوە:

لازم بی وەنەم لەفزی گۆرانی

نەزمێ بواچون پەی کوردستانی

پەی لەفزئارایی ساف و خۆش کەلام

فائیدەش عام بۆ پەرێ خاس و عام

تا نەسیحەت بۆ پەرێ بەندەگان

هەم وەصییەت بۆ پەی وامەندەگان(32/2)

دەوڵەتنامە زیاتر لە 900 بەیتە. دانەر دابەشی کردوە بە سەر سەرەتا و موقەدیمە و دوانزە باب و خاتیمەدا:

بابی یەکەم دەربارەی رونکردنەوەی ئەوەی نەگبەتی ئەهێنێ

دوەمی ئەوەی فەرامۆشی ئەهێنێ

سێیەمی ئەوەی بیر تیژ ئەکا

چوارەم و پێنجەمی رونکردنەوەی ئەوەی تەمەن درێژ ئەکا و ئەوەی تەمەن کورت ئەکا

شەشەمی لە بارەی رونکردنەوەی ئەوەی دڵ رۆشن ئەکا

حەوتەم و هەشتەمی لە بارەی ئەوەی ئابروی مرۆڤ ئەبا و ئابڕوی زیاد ئەکا

نۆیەمی لە بارەی ئەوەی روناکی چاو زیاد ئەکا و کەمی ئەکا

دەیەمی لە بارەی ئەوەی دەرگای رزق ئەکاتەوە و هەژاری ناهێڵێ

یانزەهەمی ئادابی دوعا و کاتی گیرا بونی و دوانزەهەمی هەندێ دوعا

ئینجا کۆتایی کتێبەکە

رواری لە "مقدمە" دا رو ئەکاتە وەرگر ئەڵێ:

ئەگەر کودەکی رۆڵە بوانە!

ئەر کامڵەنی برا بزانە!

ئەر ناخواندەنی بژنەوە بە گۆش!

ئەر شنەفتەنی باوەرە وە هۆش!

ئەر عالمەنی بوزە ئەو ویرت!

چە رەنگش فەرمان ئوستاد و پیرت

نەک چون قوتابی بە میم واتش بیم　　　واتش: واچە میم، وات: ئوستا من نیم(36/2)

لە کۆتایی دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| خودایا بە حەق چهاردە مەعسوم | ئەی چواردە فەسڵ چونکە بی مەنزوم |
| ئەگەر ماڵدارن مواچان قارون | ئەگەر بێ ماڵەن سوک و سفلە و دون |

ئەر ساحیب ماڵەن، مامەن یا خاڵەن ئەگەر بێ ماڵەن ئەو بەیتولماڵەن
سەید شەریفی وات جە ئاخر حاڵ عیز و مەردی عیلم، عیز و عیلمی ماڵ(167/2)

شکستە و بەستە جە لات بۆ قبول پەرێ خاص و عام نەفعش بو مەحسول
ئیمەیچ توفەیلی بیاومی بە فەیز ئەجری ناتەمام نەبۆ وێنەی غەیز
- کلم الناس قدر العقول - پەی رەکیکی لەفز عوزرم هەن قوبول
بە مەعنی نامش بی دەوڵەتنامە خامە وەش کەلام ئامە یا نامە

یە واتەی خضر ئیبن ئەحمەدەن
موحتاجی رەحمەت خودای ئەحەدەن
بە نەزمش ئاورد پەرێ ئەتفالان
پەی مەکتەبی‌یان، ساحیب ئیقبالان
بۆ بە نمونە پەی کەمالشان
نشانیوە بو جە ئیقبالشان(169/2)

رواری بە وتەی خۆی دەوڵەتنامەی بۆ فێرکردنی منالان و مەکتەبییان داناوە. بەڵام سەرنجدانی ورد لە ناوەرۆکی کتێبەکە دەر ئەکەوێ کە دانەر نەیتوانیوە مەبەستەکەی، وەکو ویستویەتی، بهێنێتە دی چونکە:
یەکەم، ژمارەیەکی زۆر ناوی زانا و فەقیە و دەسەڵاتدار و کەسایەتی ئەفسانەیی هێناوە، جەنجاڵیەکی ئەوتۆی دروست کردوە مەگەر خوێندەوارێکی رۆشنبیر سەری لێ دەربکا.
دوەم، ژمارەیەکی زۆر ناوی ئایەتی قورئان و ئایەت و حەدیسی پێغەممەر و پەندی عەرەبی و فارسی تێهەڵکێشی بەیتەکانی کردوە، ئەگەر یەکێ زمانەکانی عەرەبی و فارسی بە باشی نەزانێ ناتوانێ تێی بگا.

رواری لە دەوڵەتنامەدا چەند بابەتێکی تێکەڵاو کردوە و هەوڵی داوە بە یەکیانەوە ببەستێتەوە، لەوانە:
یەکەم، هەندێ ئەحکامی دینی.
زۆری بابەتەکانی پەیوەندی‌یان بە بیروباوەڕی دینیەوە هەیە ئەشێ زانایەکی ئایینی هەڵیان بسەنگێنێ و، لێکدانەوەی ئاینی‌یان بۆ بکا.

دوەم، پەند و ئامۆژگاری و رێنمایی.
گەلێ ئامۆژگاری وەرگری کردوە بۆ هەڵسوکەوتی رۆژانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا، تەنانەت هەندێ لە ئامۆژگاریەکانی پەیوەندی بە رەفتاری تایبەتی مێردەوە هەیە لە گەڵ هاوسەرەکەی.

سێیەم، چارەکردن یا دەرمانی هەندێ نەخۆشی.

### 3. زەمانەی ئەندەن
یەکێکی ترە لە دانراوەکانی رواری. زیاتر لە 670 بەیتە.
مەبەستی لەم نامەیە پەیامێک بوە بۆ خەڵک کە هەرکەسێ لە هەر پلە و پایەیەک دا بێ هەر ئەمرێ. دنیاش ئەوەندە "ئەند" ی نەماوە تێک بچێ و کۆتایی بێ، ئەوسا هەمو کەس ئەکەوێتە بەر لێپرسینەوە. ئەو

موسوڵمانانەی کرداری باشیان هەبوبێ ئەچنە بەهەشت و، ئەوانەش بەدکردار بون ئەخرێنە دۆزەخەوە. ڕواری باسی پردی سیرات و ناو بەهەشت و ناو جەهەنەم ئەکا و، وردەکاریەکانی خۆشیەکانی بەهەشت و ئازارەکانی جەهەنەم وێنا ئەکات.

لە بەشێکی ئەو بەشەدا کە بۆ باسی بەهەشتی داناوە ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| بەهەشتش هەشتەن، هەر یەک بە تامێ | هەر یەک بە ڕەنگێ، هەر یەک مەقامێ |
| نە بەند، نە بوهتان، نە قورب و نە فەند | نە گیر، نە گرفت، نە دوستاخ، نە بەند |
| نە تەوق، نە زنجیر، نە زەلیل، نە زار | نە خەوف، نە خەتەر، نە مور و نە مار |
| نە تیغ، نە تفەنگ، نە سوهام، نە سەیف | نە قاتڵ، نە قەتڵ، نە حەریف، نە حەیف |
| نە زاریع، نە زەرع، نە کاسب، نە کشت | نە دەردی سەرەن، نە شکەم، نە پشت |
| نە ئێشی گۆش و نە ئێشی چەمەن | نە ئێشی کۆڵنج، نە یاگەی خەمەن |
| نە عەیب، نە عیللەت، نە هۆ نوقسانی | نە مات، نە پەشێو، نە پەشیمانی |
| نە خەم، نە غوسسە، نە زەعفی پیری | نە بیمی مردن، نە خەوفی سێری |
| نە گەرم و نە سەرد، نە حەڕ و نە بەرد | هەوا موعتەدیل، چون مینای بێ گەرد |
| بێ خەوف و خەیاڵ، جە سەیری گوڵگەشت | حاسڵەن سابیت، بەهەشتەن بەهەشت!(60/3) |

لە باسی جەهەنەم دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| دۆزەخ بەحرێوەن جە ئاهیر جۆشان | خودا بە کەرەم سەری ئەو پۆشان |
| جە نرکەی نیران، نائیرەی سەعیر | جە لوشەی نەبەرد تۆفی زمهەریر |
| "اعاننا الله" یا فەردی قەدیم | "اجرنا من نار، عذاب الیم" |
| دۆزەخ پڕ ئاهیر، هەم پولی سیڕات | مەویەراش بە سەر تەمام مەخلوقات |
| جە ئەڵماس تیزتەر، جە مو باریکتەر | ڕای سێ هەزار ساڵ، چی سەر تا ئەو سەر |
| هەزار ساڵ پایین، هەزار بەرفەراز | هەزار لابەلا، باریک و دراز |
| بە ئەمری قادر، بە فەرمودەی حەق | نە سەرچای بێدەر، کریان موعلەق |
| بە حوکمی حاکم، پادشای خەبیر | مەویەراش بە سەر، سەغیر و کەبیر |
| گرد حازر مەبان نەڕاگەی سیڕات | گوزەرگای سەرپرد، ڕای هات و نەهات |
| پا منیان سەر پرد، باریکی مو تەرز | بە سەد شۆکەشۆک، بەدەن پڕ جە لەرز |
| مەویەران ناچار نە ڕوی سیاتار | بەعزێ گرفتار، بەعزێ ڕستگار |
| موئمینان مەیان چون بریقەی بەرق | چون شۆڵەی خورشید، بەربیۆ نە شەرق |
| مەویەران چون تیر، یاخۆ چون بای وەشت | ئەهلی نەجاتەن، مەشان پەی بەهەشت |
| نیمێ مەویەران، چون ویەردەی تیر | نیم دو ساغ مەبۆ وە بەندی زنجیر |
| پا منیان وە سەر سیڕات چون شمشێر | پاشان دو نیم بۆ و دەست مەبان گیر |
| دەسشان دو نیم بۆ، گرد مەگنا بەوار | گشت خەجاڵەتبار، ڕوشان چون دەوار |
| سیڕات چون درەخت، بەندەگان خەزان | نیمێ مەویاران، نیمێ مەڕێزان |
| نیم نەجات یافتە، نەو ترس و لەرزە | نیم ڕێزان بە وار، بە وێنەی تەرزە...(66/3) |

## گوڵچنینێ لە بەرهەمەکانی

### دەرمانی چاو

لە سەردەمی رابوردودا چاوئێشان، چاوخێل بون، چاوکزبون، چاو کوێربون... لە دەردە بڵاوەکان و لە کێشە دژوارەکان بوە. لە کوردستان نە پزیشکی پسپۆڕی چاو هەبوە، نە کۆلێجی پزیشکی. نە زانیویانە چاویلکە چیە. رەنگە لە هەندێ شوێن "حەکیم" هەبوبێ، ئەویش لە هیچ دامەزراوەیەکی زانستی دا نەیخوێندوە، بەڵکو لە باوکیەوە یا لە کەسێکی ترەوە پیشەکە فێر بوە. خەڵک زیاتر لەوەی روی کردبێتە "حەکیم" روی کردۆتە "مەلای مزگەوت". مەلای مزگەوت، کە بە دوانزە عیلم ناویان دەرکردوە، تەنیا توێژی زانا و رۆشنبیری کۆمەڵ بون، خەڵک پێیان وابوە ئەوان هەمو شت ئەزانن. بۆ زۆری کێشەکانی خۆیان، لەوانە بۆ چارەی نەخۆشی، رویان تێ کردون. مەلاش هەندێ جار بە یارمەتی نوسراوە کۆنەکان هەندێ دەرمانیان بۆ دیاری کردون، یان بە دوعا و "نوشتە" هەوڵی چارەسەری نەخۆشیەکانیان داون. رواری یش هەمان کاری کردوە. بۆ چارەسەری چاوئێشە و هێزی بینایی هەندێ رێنمایی و چارەی داناوە، لەوانە:

| | |
|---|---|
| پەرێ بینایی، نافیعەن عەسەل | بکێشە نە چەم بە ماء البصل |
| واردەی هیچ دەوا نیەن چون شەڵغەم | برێشە و گریا، کاڵ پەی نوری چەم |
| هەم ئاوە و هەڵچێ یا خوا ریواوی | پەرێ چەم خاسەن هەتا مەتاوی |
| ئاوە و هەناری موز، یانی مەیوەش | بدەش ئەو وەرو هامنی وەش وەش |
| هەتا بیۆ وشک، نیم جە تاڵیشار | مسقاڵێو فلفل، کەمێو عەسەل بار |
| بکەرەش سۆرمە، بکێشەش نە چەم | دەوای بیناییں، نەزانیش بە کەم |
| هەرچێو بۆوەش بۆ، بە بۆش بدارە | جە مانگەو رۆچێ، مەکەرە کارە |
| مرارە الطیر نە چەم بکێشە | سۆڵ و ترش واردەی، مەکەرە پیشە |
| ژەنگی قورقوشم، چەنی و ئاوی دەم | بساوەش نەکەف، بماڵەش نە چەم |
| پەرێ دەردی چەم، پەی مەبۆ ساکن | تەسکینش مەدۆ مەبۆ بە زامن |
| یاخۆ پارچێوە گۆشتی گۆسفەند | پێچەش وە تەوێڵ مەبۆ سودمەند(130/2) |

### ریش و شانە

پێ ئەچی لەو سەردەمەدا پیاوان بە گشتی ریشیان بەردابێتەوە. ریشی زۆر و درێژ ئاڵۆزکاوە و شێواوە و دیمەنی روخساری ناشیرین کردوە، سەرەڕای ئەوەش بۆتە هێلانەی رشک و ئەسپێ. بۆیە شانە و ئاوێنە یەکێ لە پێویستیەکانی پیاو بوە بۆ خاوێنی ریشی و رێکخستنی. رواری رێنمایی پیاو ئەکا شانەی ژنان، شانەی شکاو، شانەی هاوبەش لە گەڵ کەسێکی کە، بە کار نەهێنێ، ئەگینا نەگبەتی بە سەر دێ. رونی نەکردۆتەوە ئەمانە بۆچی نەگبەتی ئەهێنن. ئەشێ ئەم جۆرە قسانە رەنگدانەوەی باوەڕەکانی خۆی و کۆمەڵگا بن:

| | |
|---|---|
| جە دلێوە ژەنان بەدەن مەویەرە | ریشت بە شانەی ژەنان مەکەرە |
| شانە و شەریکی مەدەر وە ریشت | شانەت مەدە کەس تانە بۆ ئیشت |
| شانەی شکەستە ریشت بە شانە | نەکەری هەرگیز، نەگبەتەن ئانە |
| مەکەر بە شانە ریشت بە وشکی | لاو زەخمداری، ماوەرە مشکی(53/2) |

## جۆرەکانی مرۆڤ

رواری راوێژ و پرسوڕای بە لاوە ئەوەندە گرنگ بوە، کردونی بە پێوەر بۆ دابەشکردنی مرۆڤ بە سەر سێ جۆردا، "شەئ: شت" و "نیسفی شەئ: نیوەشت" و "لاشەئ: هیچ".
شت، ئەو کەسەیە کە ئیشێ ئەکا ئەقڵی خۆی و ئەقڵی خەڵکی تر بەکارئەهێنێ.
نیوەشت، ئەو کەسەیە کە یان ئەقڵی خۆی بە تەنیا بەکارئەهێنی، یان ئەقڵی خۆی بەکارناهێنی بەڵام ئەقڵی خەڵکی تر بەکارئەهێنێ.
هیچ، ئەو کەسەیە کە نە خۆی ئەقڵی هەیە و نە ئەقڵی خەڵکی تر بەکارئەهێنێ.

لەم بارەیەوە وتویەتی:

مەشوەرەت خاسەن، سەلاح بێ گەڕەن
شاپەڕ قوەتش بە خوردەی پەڕەن

ئینسان سێ نەوعەن: شەئ و نیسفی شەئ یاخو لاشەیئەن، وەش بزانە دەی
شەیئەن: ئەو کەسە وەختێ کەرۆ کار عەقڵو یوتەری بە عەقڵی وێش یار
نیمە شەئ کەسێن: هەر بە عەقڵی وێش یا عەقڵی یۆتەر عەمەل کەرۆ پێش
لاشەئ ئەوکەسەن: وێش عەقڵ نیەن جە پەرسای عاقڵ هەم غافڵ بیەن(90/2)

## غەم و هەم

لە "بابی دوعا" دا لێکدانەوەیەکی سایکۆلۆجی کردوە بۆ ناساندنی "غەم" و "هەم" لە دەرونی مرۆڤ دا و، چارەسەرێکی سایکۆلۆجی، کە ئەویش "دوعا" یە، بۆ دیاری کردوە:

وەرتەر واتمان غەم و قەساوەت مەبۆ پەرێ دڵ ژەنگ و رەخاوەت
دەوای هەم و غەم مەبۆ بزانی تا دڵ فارغ بۆ، دەرون نورانی
تا ئەگەر کەسبەن یا عیلم و تاعەت پەی تەحسیلش بۆت توانا و تاقەت

ئەوەل بواچون فەرقی هەم و غەم
غەم: حاڵەتێوەن نەفس پێش ماتەم

کەیفیەتێو نەفس ئەلەم یاوۆ پێش رۆح موزتەریب بۆ، خەوفش بۆ جە وێش
هەم: کەیفیەتێو نەفسی نەفسانی جە خەوف و رجا پەرێ ئینسانی
ئەمرێوەن عادەت چێش موتەسەویر یا وقوعی خەیر یا شەڕ مونتەزیر

پەرێ دەفعیشان هیچ نیەن دەوا
بە روی دنیاوە بە غەیر جە دوعا(144/2)

## داربڕین و راو

ئامۆژگاری وەرگر ئەکا دارنەبڕێ چونکە تەمەن کورت ئەکاتەوە و، راو نەکا چونکە هەژاری ئەهێنێ:

مەکەر بە عادەت بڕیە و درەختان تا بە زو نەنیات ئەو سەرو تەختان
درەختبڕ مەبۆ کەم زیندەگانی هەژاری مارۆ نەخچیرەوانی
هەرکەس سەیادەن دایم هەژارەن نەچیرەوانی روش نە ئیدبارەن(70/2)

زوڵم درێژە ناکێشێ و زاڵم تەمەنی کورت ئەبێ، بەڵام کەسی دادپەروەر ناوی زیندو ئەمێنێ:

پەی کۆتایی عومر زوڵمی زیادە سەبەبەن زاڵم مەشۆ بێ وادە
دەورەی زاڵمان کۆتا مەنزڵەن نامش مەمانۆ هەر کەس عادڵەن(108/2)

## پیری و موحتاجی

تەمەنی مرۆڤ قۆناغی هەیە، لە دایک ئەبێ و پیر ئەبێ و ئەمرێ. لە سەردەمێکی تەمەن دا مرۆڤ بە کارە و کاری پێ ئەکرێ. ئەتوانی خۆی بژێنێ، خۆی بپارێزێ، بەڵام رەنگە لە تەمەنێک دا ئیتر توانای کارکردن و خۆپاراستنی نەمێنێ. لەو سەردەمەدا قانونەکانی پەیوەندیدارن بە خانەنشینی و بیمەی کۆمەڵایەتیەوە نەبوە، هەر کەس خۆی بەرپرسی دابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی و دوارۆژی بوە، لە بەر ئەوە هەر کەس هەوڵی داوە چەندی ئەتوانێ ماڵ و دارایی پێکەوە بنێ بۆ رۆژی لێقەومان و بۆ کاتی پیری. ئەوەی خۆی بە ئەندازەی پێویستیەکانی ژیانی ماڵ و دارایی نەبوبێ، یان منداڵ و نەوەی باشی نەبوبێ بە خێوی بکا، توشی هەژاری و سەرگەردانی بوە. رواری ئەڵێ لە هەمو شت بەدتر موحتاجیە لە سەردەمی پیری دا و، ئەگەر پیری و هەژاری هەردوکی پێکەوە بە سەر هات ئەو کەسە بۆچی نەمرێ؟

جە گردین بەتەر موحتاجی و پیری پیر بی و موحتاج بی، پەی چی نەمیری؟(102/2)

## ئادەم و ئاسک

ئادەم کە لە بەهەشت دەرکرا لە هیند گیرساوەتەوە. ئاسک کە بەوەیان زانیوە بۆ موبارەکی چونەتە سەردانی. ئەویش دوعای بۆ کردون و دەستی هێناوە بە پشتیان دا. خوا لە پاداشتی ئەوەدا بۆنی خۆشی میسکی لە ناوکی ئەوان دا خوڵقاند:

وەختێو کە ئادەم، علیه السلام جە بەهەشت بەرشی، جە هیند گرت مەقام
ئاهوان شنەفت جە موڵکی خوتەن پەرێ تەبەرروک لوان بەو وەتەن
بە سیدق و ئیخلاس گرد لوای وە لاش گرد بە تەزەرروع کەفتێ خاک و پاش
ئادەم پەرێشان دوعا کەرد بە عام دەست ئاوەرد بە پشت ئاهوان تەمام
جە شەرافەتی دەستی موبارەک خوداوەند میشکش پەی دان تەدارەک
ئیدەشان شنەفت باقی ئاهوان بە تەمای نافە بە خدمەت لوان
چون بە تەما بین، نەبی نافەی ناف ئەوان بە ئیخلاس چون شین بە تەواف
تا مەحشەر نافەی ئاهوی تەبەتی جەو دما مەیۆ چێش بۆی جەننەتی(84/2)

## قەڵاچوالان و جێگەی تەنگ

خانوی تەنگ ئەشوبهێنێ بە گۆڕ و، نمونە بە سێ کەس ئەهێنێتەوە کە لە قەڵاچوالان لە ماڵی مەلا حسێن چونەتە ناو بیرێکەوە بۆ ئەوەی پاکی بکەنەوە بەڵام هەرسێکیان لە ناو بیرەکەدا خنکاون:

یانەی تەنگ، ئینسان مەکەرۆ خەفە بە زیندەی چون قەبر تێدا مەخەفە
قەڵاچوالان چەن ساڵ جەی وەرتەر سێ کەس شین وە بیر، بدانیش وەبەر
هەر یەرێ مەردی، نەفەسشان چنیا یارای کەس نەبی، تەماشان کنیا
ئەو بیرە جە حەوش مەڵا حوسەین بی ئەلحەق عالمێ و بە عیلم و زەین بی
**ئەو بیرەش پەڕ کەرد جە سرکە و جە بەرف ئاورێشان بەر بە بێ سەوت و حەرف(100/2)**

## هەڵسەنگاندن

رواری لە دانراوەکانی دا بە پێی تێگەیشتنی خۆی لە باوەڕی ئیسلام هەوڵی داوە سەرەتای دینیی"الامر بالمعروف والنهي عن المنكر" بۆ پەروەردەکردنی تاک و چاکسازی کۆمەڵ، ورد بکاتەوە و بە وەرگری کوردی بڵێ: وا بکە و وا مەکە! یان وەکو پێشینان وتویانە: "خاس بکە و خراو مەکە".
لە روی ناوەرۆکەوە ناشێ دانراوەکانی رواری بە پێوەرەکانی ئەم زەمانە هەڵبسەنگێنرێن. بەڵکو ئەبێ ببرێنەوە "زەمان و زەمین" ی دانان و هۆنینەوەیان، ئەبێ ببرێنەوە بۆ ناو ئەو ژینگە سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگیەی ئەم جۆرە بابەتانەی تێدا نوسراوە. لە دو لاوە سەیری بکرێ:
یەکێکیان، پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردی، لە ژێر سایەی حوکمی دوانەیی میرایەتی خۆجێیی ئەردەلان و حوکمی ناوەندی ئێران لە رۆژهەلاتی کوردستان و حوکمی دوانەیی خۆجێی بابان و حوکمی ناوەندی عوسمانی لە لاکەی تری کوردستان دا و، هەمو ئەو بەلایانەی لە شەڕی بەردەوام و، نائارامیی سیاسی و دارایی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی دا هاتوە.
ئەوی تریان، تێکەڵ بونی هەمو ئەو باوەڕە دینییانەی لە بنەما سەرەتاییەکانی ئیسلامەوە داکەوتون (وەکو باوەڕهێنانی بێ دودڵی بە ئیسلام و قورئان و پێغەمەر، بە مردن و زیندوبونەوە و، حەشر و نەشر و، بەهەشت و جەهەنەم...)، لە گەڵ هەمو ئەو باوەڕە ئەفسانەییانەی لە ناو خەیاڵدانی کۆمەڵگای کوردی دا، لە کۆنەوە، بە درێژایی زەمان دەربارەی ژیان و دیاردەکانی کۆمەڵ و سروشت بونەتە باوی جێگیر.
ئەگەرچی رواری لە ناو هۆنراوەکانی دا ناوی دەیان سەرچاوە و، ناوی دەیان بیرمەندی گەورەی فارسی و عەرەبی ئەهێنێ، بە تایبەتی مەولانا جەلالەدینی رۆمی، دانەری مەسنەوی مەعنەوی و پەندی لێ وەرئەگرێ:
مەولانا جەلال رۆمی مەعنەوی/ پێسەش فەرماوان ئەو جە مەسنەوی(60/2)
مەولانای رومی پەرسا جە مەتبەخ/ چێشمان هەن یاران؟ واچێنی بەخ بەخ (166/2)
هەروەها دەیان کتێبی گرنگی ئەو سەردەمەی بە خەتی خۆی نوسیوەتەوە، کەچی بەراوردی نامەکانی ئەو لە گەڵ کتێبە فارسیەکانی کە بۆ پەروەردەی ئاینی و کۆمەلایەتی و رونکردنەوەی بیری فەلسەفی و عیرفانی دانراون، وەکو گولستانی سەعدی، مەسنەوی مەعنەوی جەلالەدینی رۆمی، عەبدورەحمانی جامی، فەریدەدینی عەتار... دەری ئەخەن کە دانراوەکانی رواری لە روی "شێوە و ناوەرۆک" ەوە ناگەنە ئاستی هیچ کام لەوانە.
رەنگە ئەو بابەتانەی رواری کردونی بە بابەتی هۆنراوەکانی، بۆ ئەم زەمانە نرخێکی زانستییان نەمابێ، بگرە جێبەجێکردنی هەندێکی ناڕاست و زیان بەخش بن، بەڵام بۆ لێکۆڵینەوەی جۆری بیرکردنەوەی رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە و، هەندێ لایەنی سۆسیۆلۆجی (کۆمەڵناسی) کۆمەڵگای کوردی لەو زەمانەدا کەڵکی لێ وەرئەگیرێ. گرنگی دانراوەکانی لە ناوەرۆکەکانی دا نیە بەڵکو لە زمانەکەی دایە، کە رواری لەو سەردەمەدا هەوڵی بە کوردی کردنی نوسینەوەی بابەتی جۆراوجۆری داوە بە زمانی کوردی و، سەرەڕای ئەمەش رەنگە بۆ کەسی زمانەوان، بۆ بەراوردی گەشەکردنی مێژویی زمانی کوردی و، دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگی کوردی کەڵکی هەبێ.

# مەدرەسەی ئەدەبیی بابان

1. قاڵبە شیعریەکانی مەدرەسەی بابان
(سالم وەک نمونە)
2. جیاوازی قاڵبە شیعریەکانی هەردو مەدرەسەی بابان و گۆران
3. تایبەتمەندیەکانی مەدرەسەی بابان
4. بابەتەکانی شیعری سالم
5. هەندێ لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی

## قاڵبە شیعریەکانی مەدرەسەی بابان

### (سالم وەک نمونە)

ریچ لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان، ساڵی 1820 چەند حەفتەیەک لە سلێمانی ماوەتەوە لەو ماوەیەدا میرەکانی بابان و گەورەپیاوەکانی دیون. لە دانیشتن و کۆڕەکانیاندا بەشدار بوە، لە بەر خاتری ئەم بەزمی شەڕەکەو و شەڕەبەران و شەڕەسەگ و تیرئەندازیان ڕێکخستوە. ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانییان بۆ ساز کردوە.
بە وردی لە هەلومەرجی سیاسی، باری کۆمەڵایەتی و ئابوری، تەنانەت ژێرخان و ڕێگاوبانەکانی کوردستانی کۆڵیوەتەوە. هەواڵی شەرەفنامە و مێژوی بابانی پرسیوە. دەنگوباسی مەولانا خالید و ناکۆکیەکانی و، پایەی شیخ مارفی نۆدێی تۆمار کردوە. کەچی لەم روانینە گشتگیرەی ریچ دا لە دورونزیکەوە باسی شاعیر و ئەدیب ناکا. ئەمەش تەنیا ئەوەی لێ ئەفامرێ کە لەو رۆژگارەدا ئەبێ هێشتا شیعر و شاعیری لە سلێمانی نەگەیشتبنە پلەیەکی گەشانەوەی ئەوتۆ کە شاعیر لەو کۆڕانەدا ئامادە بێ و، شیعر لەو دانیشتنانەدا ببێ بە بابەتی باس.
ئەو تێکستانەی بە زاراوی بابان هۆنراونەتەوە و تا ئێستا دۆزراونەتەوە، کە هێشتا راستی و دروستییان بە چاکی ساخ نەبۆتەوە، چەند تێکستێکن، لەوانە:

موناجاتی شێخ سادق (1156 ک)
مەهدی نامەی ئیبنولحاج (1189 ک)
تەزکەرەتولعوامی مەلا محەمەدی سێوچی (1192 ک)
هەر 3 تێکست سەردەمیَ هۆنراونەتەوە کە هێشتا سلێمانی ئاوەدان نەکراوەتەوە (1199 ک)
ئەم 3 تێکستە هەر سێکیان دینین و هەر یەکەیان بۆ مەبەستێکی دینی دانراون. یەکەمیان پاڕانەوەیە لە خودا کە شیفای خالید پاشا بدات و، لە نەخۆشیە کوشندەکەی چاک بێتەوە. دوەمیان باسی نیشانەکانی دەرکەوتنی قیامەتە. سێیەمیان باسی هەندیَ باوەڕی دینی ئەکا. هەرسێکیان لە زمانی فۆلکلۆرەوە نزیکن. دانەرەکانیشیان تا ئێستا پاشماوەیەکی تریان لە بەر چاو نیە تا بخرێنە بەر لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن.

ئەحمەدی کۆر، کە ئەشیَ بە موکریانی دابنریَ، ئەویش تا ئێستا ڕۆژگاری ژیانی دیاری نیە و، شیعرەکانیشی بە ڕێکوپێکی لە سەرچاوەی نوسراوی باوەڕپێکراوەوە ساخ نە کراونەتەوە، بەڵکو دەماودەم کۆ کراونەتەوە.
ئەوی کە لە بەر دەستدا بیَ شیعرەکانی نالی (1800 – 1856 ز)، سالم (1805 – 1869 ز)، کوردی (1812 – 1850 ز) و نەوەکانی دوای ئەوانن. ئەوانیش ڕۆژگاری ژیانی خۆیان و ساڵی لە دایک بون و مردنیان مشتومڕی لە سەرە. بەڵام ئەشیَ هەندیَ لە شیعرەکانی خۆیان بکریَ بە نیشانەی سەردەمەکانیان.
ساڵی (1254 ک/ 1838 ز) نالی بە بۆنەی مردنی سلێمان پاشا و دانیشتنی ئەحمەد پاشای کوڕیەوە شیعرێکی داناوە.
ساڵی (1850 ز) سالم بە بۆنەی شەڕی کورد و عوسمانیەوە کە عەزیز بەگی بابان سەرکردایەتی کردوە، شیعرێکی داناوە.
ساڵی (1853 ز) بەهائوڵا لە سەرگەڵو و سلێمانی گیرساوەتەوە، کوردی تەرجیعبەندێکی بە فارسی لە ستایشیدا داناوە.
ئەم ساڵانە، کە ئەکاتە دوەم چارەکی سەدەی نۆزدە، ئەگونجیَ بە سەرەتای سەرهەڵدانی شێوەی بابانی، لە روی زمان و فۆرم و ناوەرۆکەوە، دابنریَ و، دوای ئەم قۆناغە ئیتر لە ناوچەیەکی فراوانی کوردستان دا، پێڕەوی کراوە کە لە سابڵاخی موکریانەوە تا سلێمانی و کەرکوک و کۆیە و ڕەواندزی گرتۆتەوە.
لە موکریان، وەفایی (1844 – 1902 ز)، حەریق (1856 – 1909 ز)، ئەدەب (1859 – 1916 ز)
لە سلێمانی، مەحوی (1831 – 1906 ز)، فایەق (1806 – 1889 ز)، ئاهی، فکری، خەستە، خاکی.
لە کەرکوک، شێخ ڕەزا (1837 – 1910 ز)
لە کۆیە، حاجی قادر (1816 – 1897 ز)، کەیفی (1814 – 1883 ز)، ئەختەر (1839 – 1888 ز)
لە ڕەواندز ڕەمزی
ئەمانە و هاوزەمانی ئەوان و دوای ئەوان پێڕەوی هەمان شێوەی بابانیان کردوە.

## سەرچاوەی فەرهەنگی

شوێنی جوگرافی میرایەتی بابان لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە هاو سنور بوە لە گەڵ دەوڵەتی ئێران و لە لای خوارویەوە هاوسنور بوە لە گەڵ دەوڵەتی عوسمانی. پەیوەندی بازرگانی سلێمانی – کرماشان و سلێمانی – بەغداد و، پەیوەندی میرەکانی بابان لە گەڵ فەرمانڕەوایانی ئێرانی لە کرماشان و تەوریز و دەرباری شا لە تاران و لە لایەکی ترەوە لە گەڵ وەزیری بەغدا و بابی عالی لە ئەستەمول، ڕێگەی پەیوەندی فەرهەنگی لە هەردولاوە بە روی ناوچەکەدا کردۆتەوە.

مزگەوت و مەدرەسەکان، بە زمانی عەرەبی قورئان و حەدیس و شەریعەت و زانستیە ئاینیەکانی تێدا خوێنراوە. بەڵام لەو سەردەمەدا زمان و ئەدەبی عەرەبی وەکو مێژونوسانی عەرەب خۆیان لە نوسینەوەی مێژوی ئەو قۆناغەدا ناویان ناوە ماوەی "انحطاط" بوە. بۆیە ئەدەبی عەرەبی جگە لە هەندێ شیعری کۆن و دینی کاریگەریەکی ئەوتۆیان لە سەر فەرهەنگی ناوچەکە نەبوە، بە تایبەتی کە زمانی رەسمی والی و کاروباری حکومەتی تورکی بوە و، هێشتا تورکی نەبۆتە زمانی خوێندن و نوسین لە سلێمانی.
هەر لە مزگەوت و مەدرەسەکان دا بە زمانی فارسی هەندێ کتێب خوێنراوە. زانینی زمانی فارسی ئەرکێکی پێویست بوە بۆ هەمو خوێندەوار و کاربەدەستانی ئەو سەردەمە چونکە زمانی فارسی هەروەک زمانی رەسمی دەوڵەتی ئێران بوە، زمانی رەسمی میرایەتی بابان و ئەردەڵان و، زمانی نامە و نامەکاریی‌یان بوە. ئەدەبی فارسی، لەوانە شانامەی فیردەوسی، خەمسەی نیزامی، گولستان و بوستانی سەعدی، دیوانی حافزی شیرازی، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی فەرهەنگی بابان بوە.
جگە لە دەسنوس، لەو سەردەمەدا چاپ پەیدا بوە. هەندێ کتێبی عەرەبی، فارسی، تورکی لە ئێران و لە هندستان و لە تورکیا و لە ئەوروپا چاپ و بڵاوکراوەتەوە. ئەبێ لەوانەش گەیشتبێتە کورستان.
شاعیرانی ئەم مەدرەسەیە جگە لەوەی فێری فارسی بون بۆ خوێندنەوەی سەرچاوە ئەدەبیەکانی زمانی فارسی، خۆیشیان بە زمانی فارسی شیعریان داناوە و، هەوڵیان داوە بەشیک لە دیوانەکانیان بە فارسی بێ.
مەولانا خالید، ئەگەرچی موناجات و هەندێ شیعری لاوازی بە هەورامی داناوە و چەند شیعرێکی کەمی بە لەهجەی بابان نوسیوە بەڵام هەمو دیوانەکەی بە فارسی هۆنیوەتەوە.
سالم دەیان شیعری کوردی خۆی تێهەڵکێشی شیعری فارسیی حافز کردوە. لە شیعرەکانی دا ئاماژە بە سەعدی و حافز و حەکیمی رۆمی ئەدا.
کوردی درێژترین شیعری کە تەرجیعبەندە بە زمانی فارسی داناوە. ئەویش لە شیعرێکی دا ناوی شاعیرە گەورەکانی ئێران ئەبا، ئەڵێ:

حافز و سەعدی و نیزامی، قەیس و جامی و دەهلەوی
فەیزخواە و مەعریفەتجو بون لە شاگردانی عەشق
...
شەمس و مەولانا و مەنسور کەی بە سیڕ مەحرەم دەبون
تا نەیانخواردایە رێزەی نانی سفرەی خوانی عەشق
(دیوانی کوردی: 19، هەولێر)

نالی بۆ خوێندن چۆتە سنە، سەردانی شام و مەکە و مەدینەی کردوە، ئەگەرچی سەرەنجام لە ئەستەموڵ گیرساوەتەوە، بەڵام لە ژێر کاریگەری زمان و ئەدەبی فارسی رزگاری نەبوە.
مەحوی، وەفایی، فایەق، شێخ رەزا، ئەدەب....  بەشێکی دیوانەکانیان بە فارسی داناوە.
کاک ئەحمەدی شێخ "مکتوبات" ەکەی بە فارسی نوسیوە.
بۆیە شتێکی ئاساییە ئەدەبی بابان لە ژێر کاریگەری ئەدەبی بەهێزی فارسی دا بوبێ و، هەرچی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لە مێژوی ئەدەبی کوردی دا بکرێ بە دابڕاوی لە مێژوی ئەدەبی فارسی، ناتەواو ئەبێ.

## لاساییکردنەوەی ئەدەبی فارسی

قاڵبی شیعری بابان لاساییکردنەوەی قاڵبی شیعری فارسیە و، بە چاولێکەری ئەوان قاڵبی عروزی بۆتە باو. ئیتر شیعری هەورامی و قاڵبی خۆماڵی لەم ناوچەیەدا بەرەو پاشەکشە و پوکانەوە چوە و قاڵبی بابانی جێگەی

گرتۆتەوە. تەنانەت بەندوباوی نەخوێندەواری دوای زۆر لەو شاعیرانە خراوە، کە لەم سەردەمەدا بە هەورامی شیعریان هۆنیبێتەوە.
شیعری فارسی لە گۆڕان و گەشەکردنی دا تا گەیشتۆتە قۆناغی ئەدەبی نوێ سێ سەبکی دیار ڕەنگی تێدا داوەتەوە: سەبکی خوراسانی، سەبکی عیراقی، سەبکی هیندی، سەبکی بازگەشتی ئەدەبی.
لە ناو ئەو شاعیرانەدا کە سەر بەم سەبکانەن و، لە ڕوی فۆرم و ناوەرۆکەوە، کاریگەرییان لە سەر شاعیرانی مەدرەسەی بابان هەبوە لە سەبکی خوراسانی فیردەوسی توسی و نیزامی گەنجەوی و لە سەبکی عیراقی سەعدی شیرازی و حافزی شیرازی و عەبدوڕەحمانی جامی و، لە سەبکی بازگەشتی ئەدەبی هاتفی ئەسفەهانی بون.
بە کارهێنانی وشەی زۆری عەرەبی و ڕستەی ئاڵۆز و سەخت، لاساییکردنەوەی سەبکی عیراقی بوە و، لە قاڵبی شیعردا هەمان قاڵبە شیعریەکانی شاعیرانی فارسیان بەکارهێناوە: غەزەل، قەسیدە، قیتعە، تەرجیعبەند، تەرکیببەند، روباعی، موسەمەط، موخەمەس، موسەدەس، مولەمەع، تەضمین و، لە کێشی شیعرەکانیشیان دا زۆری کێشە عروزیەکانی ئەوانیان پێڕەوی کردوە.

## سالم و ئەدەبی فارسی

سالم وەکو لە شیعرەکانی دا دەرئەکەوێ سەردانی ئێرانی کردوە، ئەڵێ:
ئیبتیدا بۆ ڕەی کە هاتم فیکری عەقڵیم لێ نەکرد
حەپسی تارانم گوناهی کاری بێ تەدبیرمە (دیوان: 128)
....
بە عەقڵ ئەمڕۆژە پێم زانی دەفەوتێ
کە سالم عازمی موڵکی عەجەم بو (دیوان: 110)
.......
لەگەڵ دڵ شەرتە سالم گەر نەجاتم بێ لە تارانا
بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی بە ئێرانا گوزەر ناکەم (دیوان: 85)
.....
ئەی قیبلەی موراثان ئاخۆ بە ڕۆژگاران
جارێ لە کەس پرسیوتە حاڵی غەریبی تاران؟
....
چ بڵێم حاڵەتی دڵ چۆنە لە هیجرا سالم
سەحنی گوڵزاری سەنەندوج وەکو زیندانی منە (دیوان: 131)
...
بە بێ ڕوی تۆ فەزای باغی سەنەندوج
لە ناو دڵما وەکو ناری سەقەر بو (دیوان: 110)

سنە و تاران دو ناوەندی فەرهەنگی گرنگی ئەو زەمانە بون.
سالم لە شیعرەکانی دا ئاماژە بە سەعدی و حافز و شەوکەت و شەمسی تەبریزی و جەلالەدینی ڕۆمی ئەدا:
سەد مەولەوی بە فتوەی دڵ دەبنە عیسەوی

گاهێ ئەگەر لە گێسویی تەرسا بەدەرکەوی (دیوان: 151)

....

سالم کەلامی کوردی و بێوەزن و لەنگ و سست

بێ مەعنایە بگاتە ئەلای شێخی مەعنەوی (دیوان: 152)

....

حەیرانی رەهی عەشقن گەر شەمسە وە گەر مەنسور

سالم نبود پیدا زین بادە بە پیمانی (دیوان: 150)

لە شیعرێکی تری دا کە "ملمع" ە لە سەر شیعرێکی سەعدی ئەڵێ:

ئەی بە تەلعەت ماهی تابان، وەی بە عیزەت ب ت

زلف داری هم چو عنبر لب چو ش ک ر

س ا ل م ئاگاهە بۆ کیزب و خیلاف

این غزل گفتەاست مسکین س ع د ی

...

ملمع لە سەر شیعری شوکت:

بە سالم شەوکەتە زنجیری مجنونی لە کۆی لەیلا

اسیر خال او گردم ز تیر چشم جادویی

.....

سالم زیاتر لە 10 شیعری مولەمەع (ملمع) ی هەیە کە میسراعی یەکەمی بە کوردی شیعری خۆیەتی و میسراعی دوەمی بە فارسی شیعری حافزی شیرازیە.

ئەگەر ئومێدی دڵ بێنێتە جێ ماهی جیهان ارا

بە خال هندوش بخشم سمرقند و بوخارارا (دیوان: 24)

....

سوبحی نەورۆزە وەختی بەزمی شەراب

الصبوح الصبوح یا اصحاب (دیوان: 43)

...

بەدەل کەین با بە نەشئەی مەی خوماری میحنەتی دنیا

الا یا ایها الساقی ادر کاسا وناولها(دیوان: 36)

...

دڵە خەڵوەت سەرای حەزرەتی دۆست

دیدە ایینەداری طلعت اوست (دیوان: 47)

....

بێنە سا بادی سەبا لەم وەختەدا پەیغامی دۆست

تا کنم جان از سر رغبت فدای نام دوست (دیوان: 48)

....

غەیری فیکری (72)
گوارەت (74)
لیلی وشان (77)
سەهی قەدان (83)

### دەسپێک

هەمو شیعرەکانی بە دو میسراعی هاو قافیە دەس پێ ئەکا و، ئیتر قافیەکانی تا کۆتایی شیعرەکە چ غەزەل بێ یا قەسیدە لە سەر یەک ئاواز ئەمێنێ. قافیەی میسراعی دوەمی بەیتەکانی لە بەیتی دوەمیەوە تا کۆتایی یەک جۆر قافیە ئەبێ.

| | |
|---|---|
| ............................. ئەلف | ............................. ئەلف |
| ............................. ب | ............................. ئەلف |
| ............................. ج | ............................. ئەلف |

### کۆتایی

سالم کۆتایی شیعرەکانیشی بە درکاندنی "تخلص" ی خۆی، واتە بەو ناوە ئەدەبیە هێناوە کە بۆ خۆی هەڵی بژاردوە. بە دەگمەن شیعری هەیە لە دوا بەیتیدا ناوی خۆی تێدا نەهێنابێ، رەنگە ئەویش ئەنقەست بوبێ.
شاعیرانی کورد بە گشتی "تخلص" ێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە کە چەشنە دەربڕینێ بوە لە زەلیلی و داماوی و بەدبەختی: نالی، هیجری، مەشوی، مەحوی، خەستە، ئاهی، حەریق، خاکی، غەریب... "سالم" یش سەرەتا "بیمار" ی کردوە بە "تخلص" ی خۆی، دوایی گۆڕیوێتی بە "سالم".

### چەشنەکانی

سالم بە چەندین قاڵب شیعری هۆنیوەتەوە:

#### 1. غەزەل

غەزەل، پێکدێ لە 5 تا 10 بەیت. دو میسراعی بەیتی یەکەم و میسراعی دوەمی هەمو بەیتەکانی تر هاوجۆر ئەبن. گرنگ نیە کێشەکەی چەند بڕگە بێ.
غەزەل وشەیەکی عەرەبیە بۆ باسی دڵداری بە کار ئەهێنرێ، بەڵام ئەشێ لە هەمان قاڵب دا بابەتی جۆراوجۆری پێ بهۆنریتەوە.
تەلاری هۆنراوەیی غەزەل بەمجۆرەیە:

| | |
|---|---|
| .........................الف | ......................... الف |
| ......................... ب | .........................الف |
| .........................ج | .........................الف |
| ......................... د | .........................الف |

.................... بە هەمان شێوە تا دوایی

